# فەرهەنگۆک بۆ بەرەو موکریان

* ماسوو (ماسویّ): گوندێکە لە نێوان لاجان و سابڵاغ دا، کە هەژار لە سەردەمی منداڵی دا ماوەیەک لەویّ ژیاوە .
* قازیاویّ (قازیاوا) : گوندێک بوو لە نزیک سابڵاغ. هەژار زۆر منداڵ بووە لە هەواری ماڵە خاڵانی ، کە لەسەر چەمی ئەو گوندە هەڵیان داوە، ماوەیەک ڕای بواردووە. قازیاوا هەر ئێستێ کەوتۆتە ژێر ئاوی بەربەندی مەهاباد.
* پردی سوور: پردێکی سەرچۆمی مەهابادە، کە دوای لێدانی بەربەند، پردەکەیان وێران کرد.
* باغی مکایل : باغێکی سەرسەوی پەنا چاری مەهابادە. سەیرانگەیەکی خۆش و دڵگرە.
* ماملێ : مامۆستا محەمەدی ماملێ ، هونەرمەندی دەنگخۆش و پیاوچەکی کورد.
* خەزایی : کێوێکە لە باکوری مەهاباد ، کە کانیاوێک و دارێکی تووی سووری لە داوێن دا بوو.
* گڕاو : سەرچاوەیەکی ئاوی گۆگردییە کە بۆ دەرمانکردنی نەخۆشینی پێست زێدە بەکەڵکە. ئاوی گڕاو هەرکە لە سەرچاوەکەی کل دەبێت، دەبێتە بەر. لە دەور و بەری شاری مەهابا دا چەندین سەرچاوی گڕاو هەیە.
* تاقە دار : تاک دارێکی کۆن و قەدیمیە کە لە داوێنی خوارەوەی شاخی گردەڵە، لە ڕۆژئاوای شاری مەهاباد ، لە سەر گۆڕێکی کۆن شین کراوە.
* مەحمودکان : گردێکە لە باکوری شاری مەهاباد، کە سمایل خانی سمکۆ ، لە سەر ئەوە گردە، دژ بە هێزەکانی ئێرانی شەڕی کردووە . کوژراوەکانی هێزی ئێرانی لە داوێنی ئەو گردەدا چاڵ کراون.
* بداغ سوڵتان : ئەمیرێکی بەناوبانگ بوو کە حکومەتی سابڵاغ و دەور وبەری پێ سپێردراوە. بداغ سوڵتان لە ئاوەدانکردنەوەی سابڵاغ دا دەورێکی بەرچاوی بووە. مزگەوتی سوور لە کارەکانی ئەو ئەمیرەیە. بداغ سوڵتان سکەی پوڵی وردی لێداوە ، کە جنسەکەی کە (مس) بووە.
* غەوسی سانی : شێخ عوبێدولاهی شەمزینان، سەرهەڵدان و ڕاپەڕینێکی ڕێبەری کردووە کە دژ بە دەسەڵاتداریی ئێران شەڕی کردووە و هەتا نزیک شاری مەراغەی لە دەست ئێران ئەستاندۆتەوە.

* شێخ بابا : شێخی غەوساباد بووە. شێخ بابا بە پێی قەولێک کە ڕووسەکانی سەردەمی تزاری پێیان دابوو لە ڕاپەڕینەکەی دا یارمەتی پێ بگەیەنن بۆ وەدەستهێنانی سەربەخۆیی کوردستان، بەمەرجێک دژ بە عوسمانییەکان شەڕ بکەن، بەڵام ڕوسەکان هیچ یارمەتییەکیان پێ نەبەخشی. تورکەکان هاتن و شێخ بابا و حەمەحسێن خانی سەردار و سەیفەدین خانی سەقزییان گرت و لە سێدارەیان دان.
* مەلیك زادە : سەرکردەیەکی ئێرانی و خزمی شای ئێران بووە. مەلێکزادە بە لەشکەرێکی گرانەوە هێرشی هێناوەتە سەر شاری سابڵاغ. سمایل خانی سمکۆ لە شەوێک دا هێرش دەکاتە سەر مەلیکزادە، هێزەکەی تێک دەشکێنێت، مەلیکزادەش دەکوژرێت.

* کۆمەڵی ژ. ك : کۆمەڵەی ژیانەوەی کەرد لە ساڵی 1942 دا لە شاری سابڵاغ پێک هاتووە.
* حەمەحسێن خانی سەیفی قازی ، وەزیری بەگری و فەرماندەی لەشکری کوردستان کە دەگەڵ پێشەوا قازی محەمەد لە دار دران.
* قورغ : قوپییەک بوو لە مەهاباد ، کە وەژێر ئاوی بەربەندی مەهاباد کەوت. بای قۆرغێ بەناوبانگ بووە.
* گەڕەکی شوانان: گەڕەکێکی شاری مەهابادە، کە زۆربەی دانیشتوانی ئەو گەڕەکە، لە لادێکانەوە هاتبوون.
* چاوڕەق : ناوی بنەماڵەیەکی بەناوبانگی مەهابادییە، کە کاری پزشکی و شکستەبەندی و ئۆرتۆپێدیی یان کردووە.
گەرماوی شوجاع : حەمامی شوجاعولمولك. حەمامێکی کۆن بوو لە مەهاباد.
* شادەروێش : مزگەوتێکە لە گەڕەکی ڕزگەیانی شاری سابڵاغ ، کە حەوشە و حەسارێکی خۆشی هەیە . سەوزەیخانە و دار و درەختەکەی بەناوبانگ بووە.
* ڕزگەیی : گەڕەکی ڕزگەییان . یەکێک لە گەڕەکە کۆنەکانی شاری سابڵاغ ، کە ماڵی مامۆستا هەژاریش ماوەیەک لەو گەڕەکە دا بووە.
مەولەوی: نازناوی بنەماڵەیەکی کۆنی مەهابادییە، کە کاریان پزیشکی و دەرمان کردنی خەڵک بووە. کوڕەکانیان هەر ئێستا دوکتورن.
* خاڵە سوورە: چاکێك بووە لە گەڕەکی قوڵەقبران لە شاری مەهاباد، دارێکی سەرسەوزێشێ بەسەرەوە بووە. ئێستا نە گەڕەکی قوڵەقەبران ناوەکەی ماوە و نە چاك و نە دار.
* خانەقای نەهری: تەکیەی بەرەی شێخەکانی شەمزینانە کە شان بە شانی مزگەوتی هەباس ئاغایە لە مەهاباد دا.
* شێخ عەبدولقادر و شێخ محەمەدی شەمزینی لە لایەن تورکانەوە لە ڕێی ئازادیی کوردستاندا بەدار داکران.
* گەڕەکی خڕێ: یەکێك لە گەڕەکەکانی شاری سابڵاغە، هەژار لەو گەڕەکەدا لە دایک بووە.
* گەڕەکی قوبڵە: یەکێك لە گەڕەکەکانی شاری مەهابادە. وەفایی، شاعیری مەزنی کورد لەو گەڕەکە ژیاوە.
* گەڕەکی ئەرمەنیان ، سەرپلوسك ، پشت قەلا ، گەڕەکی حاجی حەسەنی: لە گەڕەکە کۆنەکانی شاری مەهابادن.
* عیمادی: ناوی چایچییەکی قەدیمەی شاری مەهاباد بووە.
* حەمە شەل: کەبابچییەکی قەدیمەی شاری مەهاباد بووە.
* بەستێنی چۆم: تەنکاوێکی چۆمی مەهاباد بوو کە جێگای سەیر و سیاحەت و ئاوهێنانی ژنان بوو.
* چوارچرا: گۆڕەپانێکە، کە بۆ یەکەمجار لەوێ ئاڵای کوردستان هەڵکرا. هەر لەو مەیدانەشدا پێشەوا و سەدری قازی و سەیفی قازییان بەدار دا کرد.
* خاڵەمین: شاعیرێکی سەردەمی کۆماری کوردستانە لە مەڵبەندی مەهاباد ژیاوە.
* سەید عوبەیدیلا ئەیوبیان: نووسەر و مامۆستای زانکۆ تەورێز، کە چەند کتێبی بەیتی کوردی وەك : مەم و زین ، خەج و سیامەند ... ی چاپ کردووە.
* مزگەوتی سوور: کۆنترین بینایە کە بداغ سوڵتان سازی کردووە. مزگەوتی جامیعی

مەهابادە.
* گەڕەکی دارۆغە ، کۆیین ئاوا: دوو گەڕەکی شاری مەهابادن.
* داشامەجید: ناوی کێوێکە لە لاشانی مەهاباد دایە لە بەری ڕۆژهەڵات.
*لالەباس: ناوی باغێکە لە مەهاباد.
*مێشەی کورتانی : ناوی دارستان و مێشەیەکی لە مەهاباد.
*باغی سیسە: باغ و سەیرانگایەکی خۆشی مەهاباد بووە .
* کانی مام قەمبەران: سەیرانگایەکی کۆنە مەهاباد بووە.
* گومبەزان: گۆڕخانەی بەرەی بداغ سوڵتانە و زیارەتگایە لە مەهاباد.
* باغی شێخی: سەیرانگا و باغ و بێستانی خۆش بووە لە مەهاباد کە ئێستا نەماوە.
* زاوا و بووک : کێوێکە لە نزیک مەهاباد.
*سارەوانان: گوندێکە نزیک مەهاباد. دایکی هەژار کە سەیدزادە فاتمی کچی سەید حەمەدەمینی نوورانییە، خەڵکی سارەوانان بووە.
* بەسری: کێوێکە لە نزیک مەهاباد دا، کە زۆر جاران دز و جەردە خەڵکیان لێ ڕووت کردووە.
* سەید وەقاس: کێوێکە لە نێوان چۆمی مەجیدخان و قەمتەرە و بورهان دایە. گۆڕێکی لێیە بەناوی سەعدی وەقاس، کە جێی زیارەتە.
* کاك: نیاز مەلا ئەمجەدی قەڵایە کە نازناوی شیعری کاک بوور.
* سوڵتان و سلێمان ئاغا : دوو دەوڵەمەندی چۆمی مەجید خان بوون، کە ئەم دووە دژی کۆمەڵەی ژ.ک بوون.
* ئێساکەند: گوندێکە لە موکریان، کە هەژار سەردەمێک وەک فەقێ لەوێ خوێندوویەتی.
* کاکەجان: چاکێکە نزیک گوندی سەهۆلان ، کە کور و کچی لاو دەچنە سەری و نیازی لێ دەخوازن.
* پیری بورهان: نیاز شەمسەدین شێخ یوسفی بورهانییە کە لە خانەقای شەرەفکەند نێژراوە. سەردەمێک هەژار لەوێ فەقێ بووە.
کانێ دولمان و لوساوکان: دوو جێگەن لە خانەقا.
* سەید ڕەشید: عالم و شاعیر و قسەخۆشی بەناوبانگ، کە دوو نازناوی هەبووە ؛ چاوەش و شەهید .
* نورانی: سەید حەمە سەعیدی کولیجیی عالمی بەناوبانگ، کە مامی دایکی هەژار بووە.
* مەولانا: مەلاسادقی خەلیفەی شێخی بورهانە کە پردی قەرەقشلاغ و قەلاتاسیان و ڕێگەی بەسری ئەو دروستی کردوون. مەولانا خاڵی باوکی هەژار بووە.
* شێخ محەمەد: زانایەکی زۆر بەناونابگی موکریانە کوڕە گەورەی شێخی بورهانە و بەسەر خانەقا ڕاگەیشتووە.
* باغی فاتێ: باغێکە لە نێوان خانەقا و گوندی شەرەفکەند دا.
* گوارتە گوێ: کێوێکە لە نێوان خانەقا و گوندی ئاشی گوڵاندا.
* شەرەفکەند : گوندێکە باوکی هەژار لەوێ لەدایک بووە.
* باغی مەلا، ئاجیکەند، خوراسانە، ئاشی مەلا ، تازەقەڵا ، سەردەراباد ، تەرەغە ، باغچە، سەرباخچە ، چواردیوار، قەرەڵی ، نۆبار، عیلماباد ، کانیە ڕەش و ئاشی گوڵان : چەند گوندێکن لە موکریان .
لالەش : شوێنێکی پیرۆزە لە لای موسڵ، جێی گۆڕی شێخ هادییە و زیارەتگای ئێزەدییەکانە.

* پیرسڵەمان، کۆشکی خات زارا ، میرقاز، پێمەڕەی فەرهادی = چەند شاخێکن لە دەور و بەری خانەقا و شەرەفکەند و ئاشی گوڵان و...
* لێڕەبیر ، چامە ، سەقتی، بنی پیرس، ڕێزان، چیای شیرن = ناوی چەند شوێنێکن لە بارزان.

* پیرمحەمەد = چاکێکە لە گوندی بوغدەداغی لە موکریان. دەڵێن خۆڵی دەور و بەری ئەو چاکە دەرمانی تیراوێیە.
* سەفین و هەڵگورد و پیرس و پیران= ناوی چەند چیایەکن لە باشووری کوردستان.
ئاگری ، ساسۆن، تۆرۆس و جوودی = ناوی چەند چیایەکن لە کوردستانی باکوور دان.

***

گەڕانەوە

## چوارخشتەکییەکانی حەکیم عومەری خەییام

مامۆستا هەژار کردوویەتە کوردی

تیرێژ کە بە ڕۆژ و پێل بە دەریا دریا
لەو ڕۆژەوە گوڵ پێکەنی، بولبول گریا
خوا نووسی لە چارەی ڕەشی ئێمەش بەشمان
ژینێکی هەژاری پڕ لە خۆزیا و بریا

***

گریا گولێ بۆ گوڵاو سەر ئاگر نریا
ئەم بۆن و بەرامەیەم نەبووبا بریا
نرخی هونەر و جوانی یە دەیبا گەردوون
کێ پێکەنی جارێکی، هەزار جار گریا

***

بێهوودەیە بیر و خەم، دڵت خۆش کە برا
پرسیار نەکرا، بەشت درا هەرچی درا
تۆ هێشتە نەهاتوویە جیهان ڕۆژی بەرێ
ئەو ڕۆژە دەبوو بچیتە دەر، دیاری کرا

***

بەس هەڵ بخولێ بە دەوری پیس و پاکا
تا کەنگێ بە شوین هەموو خراپ و چاکا
گەر زەمزەمی، یان دای بنێ ئاوی ژیانی
ناچاری دەبێ ڕۆچی بە سینەی خاکا

مردن چییە؟ کەس تێ نەگەیی تا وێستا
تەوڕات و زەبوور، تا دەگەیە ئاوێستا
زۆر کەس لە ژیان دواوە زانایانە
بۆ باسی مەرگ گێل و نەزان ڕاوێستا

***

بیستوومە بەهەشتێ هەیە حۆری تێدا
ڕووباری شەڕابی پاکی دەڕوا پێدا
من لێرە مەی و یارێ پەیاکەم چ دەبێ؟
دەسکەوتەکە هەر یەکن بە هەر دووک ڕێدا

***

ئەو ڕۆژە خودا سانی گیانی ڕانا
دەیزانی بە کردەوەم، خودایە و زانا
هەر خۆیەتی دایناوە هەڵە و سەرپێچم
سووتانی جەهەندەمی لەبەرچی دانا!؟

***

گۆیا لە جەهەندەمن ئەڤیدار و مەست
بەم واتەیە پێکەنیم و گۆستی خۆم گەست
جێی چەند کەری کوڵکنە ئەگەر وابێ بەهەشت
یان چۆل و بیابان و کپە وەک لەپی دەست

بیرت دێ عەبای پێوە بوو جێ باری لمت؟
ئەو بیری لە دەریای پڕ و پوچا نوقومت!
ڕیشت لە دواوە هاتە دەر بوو بە کلک
نینۆکی دەس و پێت خڕ و پڕ بوونە سمت

***

گێژی لە خەیاڵات و گلەی بەختی ڕەشت
ڕابوێرە هەتا بە جارێ نەبڕاوە بەشت
دەس بگرە بە بەندی سەر و پرچی جوانێک
تا هەڵنەوشێنراوە هەموو بەندی لەشت

***

لەو کۆشک و سەرایە دا کە جەم جامی گرت
ڕێوی ترەکیوە، مامز ئارامی گرت
بارام کە هەموو ژیانی خۆی گۆری دەگرت
دیتت بە چ جۆرێ گۆڕێ بارامی گرت؟!

***

ڕێم کەوتە گوڵستانەوە لای بولبولی مەست
بە چریکەیێ پێی گوتم گەلێ ڕاز و مەبەست:
تا گوڵ نەوریوە تا لەشت نەبوە بە گڵ
وەک گوڵ بە دەمێ، دەم بە بزە و پیاڵە بە دەست

مەیگێڕ دەوەرە بەخێری چاوی کاڵت
دڵ تینووە جەرگم ڕەشە چەشنی خاڵت
وا تۆبە بەسەر یەکا شکا وەک پرچت
بۆم تێکە مەیەک لە ڕەنگی کوڵمی ئاڵت

***

ئەی شووشە بنازم بە دڵی خاوێنت
تاوم بدەرێ بە ئاوی خەم تاوێنت
دەستم بەر ئەدەم لە ئارەزووی دوور و درێژ
مەیگێڕ لەوەلا دەستی من و داوێنت

***

هاتوومە جیهان چم بە چ کرد؟ تێ گەی: هیچ
هەر بنج و بناوانی جیهان دەرخەی: هیچ!
ڕووناکیدەرم، شەمم، کە فووم لێ کەی:هیچ
نەینۆکی دەسی جەمم، لە بەردم دی: هیچ!

***

ئەو خوایە کە گەردوون و زەوی بەرپا کرد
ئەو ڕۆژە مەکۆی دەرد و خەمی پەیدا کرد
وەک ڕژد و چنۆک هەرچی بە نرخ و جوانە
هێنای بە پەلە و گورجێ دەخاکی ڕاکرد

ڕۆژگارێ مرۆ تیا ژیابوو، ڕابرد
ئاوێ بوو بە جۆ دا چووە، با بوو، ڕابرد
هەرگیز مەڵێ وابوو، واچوو، خۆش نایەتەوە
گەر تاڵ و زەبوون ژیاوی، چا بوو ڕابرد

***

باش ڕێگە دەچووم یا خۆ گلابم ، ڕابرد
گەر دوورەپەرێز بووم و تەبا بووم،ڕابرد
ترسم هەیە بۆم بێتە ژمار ڕۆژی ژمار
ئەو ژینە کە بێ یار و شەرابم ڕابرد

***

لەش ناسک و لاوچاکی وەها هەن کچ و کوڕ
گوڵ دڕکە بەرانبەری بکەی، بێکەسە دوڕ
گەردوون کە بە دانستە دەیانکا وەک شێت
تێکیان هەڵ دەشێلێت و دەیان کاتەوە قوڕ

***

ئەم گۆزە وەکوو من بووە، دڵدار و هەژار
جارێکی دڵی خۆش بووە، سەدجار خەمبار
ئەو هەنگڵ و دەسگرەی لە ملیا دیوتە
دەستێ بووە زۆر خراوەتە سەر ملی یار

پەندێکی منالْەکەت بدە مامەی پیر
با بازی بە خاک و گڵ نەکا، ژیری بەبیر!
بێژنگی لە دەس دەرێنە! بەس دای بێژێ
کەللەی سەری پاتشا و میر و وەزیر

***

سەرخۆش بە بە مەی، لە سەر دەراوێژە کەسەر
ئەم کورتە ژیانە ڕێی خەمانی مەخە بەر
بەس گێژ و نەزان و هێڕ بە، خۆ تۆ زێڕ نی
ژێر خاک بکرێی، دووبارە بت هێننەوە دەر

***

بەس گێژ بە لە ناو پێنج و شەش و حەوت و چوار
مەی فڕکە! دەتاوێیتەوە وەک بەفری پار
نەت زانی لە کوێوە هاتگی ڕۆژی بەرێ
ناشزانی بەرەو کوێ یە بەری پاشە هەوار

***

تا کەنگێ خەریکی پێنج و چواران مەیگێڕ
دڵخۆشی بدە بە کۆڕی یاران مەیگێڕ
ژین کورتە ئەوەی نایەنێ خەم دابگرین
بۆم تێکە بە یادی چاوخوماران مەیگێڕ

خۆلامەدە ، دەی! بادە کە با بێ مەیگێڕ
بەرماڵ و جبەت گرەو لە لابێ مەیگێڕ
گوێ بگرە لەمن : هەرچی مەلا و شێخ گوتیان
دە گوێی مەگرە، لات وەکوو با بێ مەیگێڕ

***

جارێکی بە مەستی عەرەبێکی پێخواس
نەیزانی لە لۆکی هەمزە ڕاساوە بە داس
مەی بۆیە حەرام کراوە، سا سەیری کەن
کورد بۆیە دەڵێ لە هەمزە چی داوە هەباس؟!

***

بۆ گۆزە کڕین دەچوومە لای گۆزە کەرێک
سەد گۆزە بەمن پێکەنی! هەر یەک لە بەرێک
ئێمەی وەکی خۆت دەبەی! سبەینێ خۆشت
وەک ئێمە دەبی بە گۆزە ، لای بێخەبەرێک

***

ڕابوێرە بە سەربەرزی بە نان و ئاوێک
سەر دامەنەوێنە بۆ هەموو ناپیاوێک
لەم ژینە کە هەر دەمێکە دێت و دەڕوا
مەردایەتی مەفرۆشە لە پێناو تاوێک

ئای خۆزگە ببایە جێگە بۆ سانەوەیەک
لەم ڕێگەیە دوورە سووڕ و پێچ دانەوەیەک
سەد خۆزگە لە پاش نەمان وەکوو سەوزە گیا
بکرایە لە گڵ هومێدی هەڵدانەوەیەک

***

خەو بەسییە بەیانە هەستە چاوکاڵی شەپاڵ
گفتێکی شیرین بکە مەزەی بادەی ئاڵ
کاروانی ژیان دەئاژوێ ڕووو بە نەمان
هاکا من و تۆش دەبینەوە خەون و خەیاڵ

***

ئەم ژینە کە ڕادەبرێ، چ شیرین و چ تاڵ
تووش بی بە مەرگ، چ دەربەدەر بی چ لە ماڵ
بێ خەم بژی! خۆش بە! پاشی مەرگی من و تۆش
بێ پسانەوە دێن ڕۆژ و شەو و مانگ و ساڵ

***

بۆ بیری بەهەشت و ئاگرێ کەوتی یە چاڵ
خۆشتر لە خەیاڵی شیرنە بادەی تاڵ
بەس ترس و هومێدی بێ نیشان و بەڵگە
پێشینە دەڵێن: کەس بە خەیاڵ نەبوە بە ماڵ

کوا مەی؟ بڕەوێ خەم و خەیاڵ و خەوەکەم
وا ڕوو بە مەرگ گلۆر دەبێ ڕەوڕەوەکەم
ئەو خشتی لە خاکی من دەی پێژن
نێزیکە بچێتە چینی خانووی نەوەکەم

***

ئەو ڕۆژە کە مردووم و لە دنیا نابم
ئەو کاتە کە لەش تۆز و گڵی بەر با بم
خاکم بکەنە گۆزەڵە ، بۆ مەیخانە
تا مل پڕی مەی بکەن ، لەوانەم ڕابم

***

گۆزێک لە دەسم شکابوو ، ئەو گریا بۆم
خەم دات نەگریێ منیش یەکێکی وەک تۆم
زۆر جار منیش وەکو تۆ گۆزەم دەشکاند
تۆش ڕۆژێ دەبی بە گۆزە دەشکێی وەک خۆم

***

ئەم پیاڵە وتی کە هاتە سەر لێوانم
شا بووم و گەلێ وەک تۆ لە ژێر فەرمانم
لە خواردنەوەما دەفر و پیاڵەم زێڕ بوون
وا ئێستێ پیاڵەم و بە سەرخۆشانم

مەیگێڕ وەرە مەی ئاڵ بدە با بینۆشم
شەشدانگی بەهەشت بە شووشەیەک دەفرۆشم
فەرمووتە: لە پاش مەرگ بەرەو کوێ دەم بەن؟
سەرخۆش کە دەڕۆم، کێوە بچم دڵخۆشم

***

ئاخ خۆزگە لە مردنا بە مەی شۆراوم
ژێر سێبەری مەیخانەیەکا نێژراوم
کێ ڕۆژی قیامەتێ منی دێتەوە بیر
هیچ بۆم نەگەڕێ، لە چۆمی مەی خنکاوم

***

مەیگێڕ بگە پێم! لە بێ مەیی ماڕووتم
توورم بدە کووپەوە لە دووریت سووتم
گۆڕم لە پەنا ڕەزان بکۆڵن. ڕەزەوان،
هەڵبەستێ لە پەلک و داری مێو تابووتم

***

چاو جوان دە مەڕۆ تێری دڵم بت بینم
گوڵ چین؟ کە لە سەر ڕوومەتی تۆ گوڵچینم
داخم کە هەبێ لە گێژەڵووکەی مەرگە
وەک پەلکە گوڵێ هەڵدەوەرێنێ ژینم

دەم بینی کە خەمبار و کز و داماوم
وا بیر مەکەوە لە مەرگ و کەس ترساوم
مردن کە لە ڕێمە ، هەر دەبێ ، ناترسم
ژاکاوی ئەوەم بە ئارەزوو نەژیاوم

***

هەر چەندی بڵێی بە بەژن و باڵا جوانم
ڕوومەت گوڵ و چاوکەژاڵ و لێو قەیتانم
وەستایێ کە وای لە خاک و گڵ داڕشتم
نیازی لەمە چی بوو؟ بۆچی کرد؟ نایزانم

***

هات و چوو بە بێهوودە منالّی و جوانیم
پیر بووم و بە بێ داخەکەم و خۆزیا نیم
شاگردی زەمانە بووم و زۆریش چەوسام
وەستام لە هەموو کار و لە هیچ وەستا نیم

***

بۆ هاتمە سەر زەوی و لە بەرچی چوونم؟
بەهرەی چ بوو بۆ خودا نەبوون و بوونم؟
هاتووم و دەچم بێ وە بزانم بۆچی ؟!
پاش مردنەکەش دوورە دەراوی ڕوونم

لەم بێخەبەری خۆمە کەساس و ماتم
بێهوودە دەبووریّ دەم و سات و کاتم
من ببم و نەبم جیهان وەکوو خۆی وایە
مەیگێڕ وەرە لێکی دەوە من بۆ هاتم؟

***

هاتن بە دەسی خۆم نەبوو هێنایانم
دەرچوونە دەریش چۆن و کەیە؟ نازانم
سەد خۆزگە نەهاتبام ، نەچووبام ، نەببام
لەم گێرە و کێشەدا ڕەحەت با گیانم

***

پاک هاتمە سەر زەوی و دەڕۆم ، ناپاکم
خۆشیم کە نەدی هەمیشە بۆی خەمناکم
سوێراوی چەمم کڵی دڵی نێڵ داوم
ژیانیشە بە با دا چووە تۆزی خاکم

***

خوا داوی دەناوە داوی ئەو با نادەم
دەعبایەکی گرت و ناوی لیّ نا ئادەم
ڕاوی ئەوە، داوی ئەوە ، دانەش هی ئەو
دەمخاتە تەڵە و گەرکیە خۆشم لادەم

گیراوە قوڕم ، خرامە قالب ، خشتم
بادراوی یەکێ ترم کە خاوم، گشتم
چاتر لەوە بم کە هەم ، لەدەستم نایە
خوا ڕۆژی بەرێ بەو کلە چاوی ڕشتم

***

دەسکاری خودایە خۆم و ئاکاریشم
بۆ هەرچی دەچم لە دەستی ئەو دا ڕیشم
هیچ کارێ بە دەست خۆم نییە ، هەرچی دەیکەم
ئەو پێمی دەکا ، هێشتە گوناهباریشم

***

بە خوێندنەوە کراوە فرچک گیانم
زانستە مژیم و بۆتە ئاو و نانم
حەفتا و دوو ساڵە بیر دەکەم ، دەخوێنم
وا تازە دەزانم چ لە هیچ نازانم!!

***

زۆر کۆلکە مەلا و شێخ هەیە ڕێم پێ دەگرن
لایان هەڵەیە لە ژینی خۆشم بدوێم
خزمینە ! نەزانین چ بەڵایەکی زلە
هاتوومە جیهان دەبێ نەزانم من کێم!

ڕۆژ گەوریە ، چۆن بە تۆپە قوڕ وەیشێرم
زانام بە گەلێ نهێنی ، خۆ دەبوێرم
زۆر پڕ لە گەواهێراتە دەریای بیرم
دەرخستن و شاندانی بە کەس ناوێرم

***

سەرکۆنەکەران دەڵێن کە: مەستی بادەم
من گوێچکە بەوان تەوس و توانجان نادەم
سەرخۆشم و مەیخانە پەرستم بۆچی؟
هەربۆیە کە خۆ لە خۆپەرستی لادەم

***

جار جارە پەنا بە مەی دەبەم، ناچارم
خەمبارم و پێم دەڵێن کە تاوانبارم
خۆزێ وەکوو مەی درۆ و دزیش مەستی دەکرد
مەردێکم دەویست کە بیگوتایە وشیارم

***

چم داوە لە کفر و چم داوە لە دین؟ من ژیرم
مەیخانە و مەیفرۆشە تەکیە و پیرم
مارەت چییە؟ پرسیم لە جیهان، کەیفە گوتی
ڕووخۆشی؟ هەواڵی تۆم و، زوێری؟ زوێرم

با هەستم و چاومەست و مەیێکی جور کەم
بەس زەردی خەمان بم و بە مەی ڕووسوور کەم
ڵاوێچێ بە ڕووی هۆشی بزۆزم دادەم
با تاویَ لە خەو ڕاچێ لە خۆمی دوور کەم

***

چاومەستە دەهەستە بێرە لام خونچە گوڵم
ماچم دەیە ، بم دوێنە ، مەشکێنە دڵم
لەم دەفری مەیەت کاسەیەکم بۆ تێکە
تا نەبووە بە دەفر و کاسە و گۆزە گڵم

***

مەیگێڕ وەرە لام چ دەربەسی بەدناویم؟
پاراوکە دڵم، سیس و کزی بێ ئاویم
مەڕوانە کە پیرم ، دەمێ سەرخۆشم کەی
پێم وایە شل و شەنگە نەمامی لاویم

***

ئەم جارە پەڵاسی شەرم و دین پارە دەکەم
ئەم دەردی هەژارییەم بە مەی چارە دەکەم
سێ بەردە دەنێمە مستی بیری پیرم
کیژی ڕەزی ڕووسووری ترێ مارە دەکەم

هێشتا لە بەهەشتا دەگەڕا بابادەم
لەو ڕۆژەوە من ئۆگری جامی بادەم
ئەو تڵتە کە پیری مەیفرۆش دەی ڕێژێ
تۆزێکی بە زێڕ و گەنجی قاڕوون نادەم

***

مەیگێڕ وەرە بەرماڵ و جبەی دەفرۆشم
ڕیشم لە گرەو دەنێم و شەی دەفرۆشم
تەزبیحی دەسم کە داوی فێڵبازانە
هەرکەس دەیەوێ بە چۆڕێ مەی دەفرۆشم

***

گیانی منە مەی کە بێ ئەوم بێ گیانم
ژانم لە دڵایە بادەیە دەرمانم
هەر ئەو دەمە لام خۆشە کە مەیگێڕ بێژێ:
هەر دوو فڕی دی؛ بڵێم بەسە و ناتوانم

***

مەی کووپەیەک و گۆشت و مەزە و نانی گەنم
جوانێ بەتەنێ لە چیمەنێ بێتە کنم
ماچی دەمی مەی نۆشی لە سەرخۆشی دا
وەبزانە کە مەزن و میری ئەو ناوە منم

مەیگێڕ بە دووچاوە مەستەکانت مەستم
تۆم لابی لە دوو جیهان بەچی دەربەستم
هاواری لە پیری دەستگیرە دەروێش
من پیرم و تۆم دەوێ کە بگری دەستم

***

مەڕوانە پەشێو و لێو بەبارم ، نە کەمم
بەرزم لە هەژاریا چیای سەربەتەمم
هەرکەس لە سەرێکەوە خودا پێداوە
من خاوەنی شەشدانگی کوڵ و دەرد و خەمم

***

مەیخانە پەرست نەبووم و تووشت کردم
بەو پیرییە بەرەو پیری ئەڤینت بردم
ڕووبینی کە لێڵاوە تکا ، تۆبە شکا
دینداری کە ڕەنگاوی ڕیا بوو ، شردم

***

کاروانە ژیان ، گەرەک بەلەز بم ، ڕاکەم
میوانی شەوی درێژی ژێر ئەم خاکەم
گیانم دەردەچوو ، وتم وچانێک ، فەرمووی:
دیواری لەشت شکستە چۆن بار ناکەم

دڵداری چ یارە؟ فێرە سەودای کردم
بڕوانە لە چاوی سوور و ڕەنگی زەردم
نرخی بزەیەک بارە لە سەر لێوانم
پارسەنگە دڵی گەرم و هەناسەی سەردم

***

کێ تا سبە دڵنیایە بۆ مان و نەمان
ئەی مانگە وەرە لە دڵ دەراوێژە خەمان
خۆش مانگە شەوە ، هەلی مەیە و مەی بێنە
تا تیشکی نەداوە مانگ لە گۆڕخانەکەمان

***

دڵتەنگی هەبێ، دەبێ بە مەی ژەنگی بەرین
بۆ بیری نەهات و هات چما خەم لە بەرین؟!
سۆزی کە مەرگ تەپڵی نەمانی لێ دا
ئەمن و تۆ دەگەڵ با بەدەمی هاو سەفەرین

***

لە نوێنی گڵا پەکوو... کە نوستوو زۆرن!
بەر بیر و خەیاڵ کەمن ، لەبیرچوو زۆرن!
هەرچەندی کە دەڕوانمە بیابانی نەبوون
سەد هێندی ئەوانی چوون ، نەهاتوو زۆرن

داخم گەلێ یار و خۆشەویستان مردوون
لەش خاکی نێوان کۆمەڵێ دار و پەردوون
چەشتمان لە مەیەک هەموو لە ناو کۆڕی ژیان
پێش ئێمە بە دوو سێ پشوو مەستی کردوون

***

گۆڕخانە نشینان کە لە بن سەرپۆشن
خۆڕایی نییە وەها کپ و خامۆشن
ئەی خوایە لە کام بادەیە دەرخواردت دان؟
بێهۆشن و بۆ هەتا هەتا سەرخۆشن

***

داخم ئەوی دێر هات و ئەوی کەوناران
هاوباوەشی مەرگن و لە دنیا تاران
کەس نایەتەوە بەرەو ژیان لێی پرسم:
لە کوێ یە بنە و باری هەواری یاران؟

***

گۆڕ هەڵکەنی من لە هیچ و پووچ دڵخۆشن
خشتی گڵی کۆنە مردووان دەفرۆشن
ڕۆژیش دێ گڵی من و ئەوان بکرێ بە خشت
تا گۆڕی هەژاری تری پێ داپۆشن

هۆ مامی هەوڕگەر ! بەسە هەڵکەی دامان
ئەو خەڵکە بە تۆ پێدەکەنن ، تێت ڕامان
هەر لاشی هەژارە و سەری شا و خونکارە
سوڕی دەدەی و دیکەیە دەفر و ئامان

***

پێک نایە هەتا سەر لە جیهانا گیر بوون
زۆر شێتی یە بێ بادە بژیم سیس و زەبوون
دەس بەردە لە کۆن و تازە وو ترس و هومێد
دنیا کە نەمام ، تازەیە یان کۆنە ، بە توون

***

زۆری وەکوو مەی قەزا و قەدەر چاند و دروون
بێهوودە چ داگرم خەمی بوون و نەبوون ؟
پیاڵێکی پڕم لە بادە بۆ تێکە وەخۆم
هەرچی دەبوو بێ و ببێ هەموو هاتن و چوون

***

هەڵسە بەسە پیش خواردن و مل کزکردن
مەی تێکە بخۆین لە باتی خەم بۆ مردن
ئاکاری جیهان ئەگەر وەفای تێدا با
نۆرەت نەدەهات لەوانی زوو ڕابردن

چ کراوه بەرێ ؟ نە تۆ هەڵی دێنی نە من
لەو بارە بە ڕاست نە تۆی کە دەخوێنی نە من
چی بۆی دەگەڕێین لە پشتی پەردێکەوەیە
گەر پەردە نەما نە تۆی کە دەنوێنی نە من

***

ئەستێرە هەمووی ئەگەر درشت و وردن
ئاوان و دەڕۆن و دێنەوە و لێک گردن
لەبڕانەوە نایە هاتوچۆی چوون و بوون
تا خوا هەیە هەردەمێنێ زان و مردن

***

ئەستێرە و مانگ و ڕۆژ لە عاسمانانن
هۆی گێچەڵ و مشت و مڕی زانایانن
چین و چ دەکەن؟ کێوە دەچن؟ چۆن هاتن؟
خۆشیان وەکوو من نەزان و سەرگەردانن

***

شادی لەمەڕایە پنجی خەم خۆمانین
هۆی زۆر و کەمی ڕەوا و ستەم خۆمانین
ڕاستی و بەزەیی و بەرز و نزم بوون ئێمەین
قاشوولکە شکاو و جامی جەم خۆمانین

بەهرەی چ وەدەست کەوت لە بوونمان گەردوون؟
قازانجی چ دێتە ڕێ لەوانەی مردوون؟
هیچ کەس نیە لەم گێژە دەرم خا و بێژێ
بۆ بوون و ژیان و مان و بۆ مردن و چوون؟

***

پیاوانێ بە ژیری و هونەران دڵخۆشن
تامەزرۆ بە ماست و دۆشن و نێر دۆشن
وا باشە ئەگەر دەکرێ نەزان و گێل بن
کەس گێزەر و تووریش بە هونەر نافرۆشن

***

مانگی ڕەمەزان نزیکە و پێمان ئێژن
مەی هەرچی هەیە بڕێژن و مەیچێژن
من هێندە دەخۆمەوە لە کلکەی شابان
مەست و کەلەلا بۆی دەکەوم تا جێژن

***

گەردوون لە سەری دایە خەیاڵێ بۆ مان
هەر وا دەگەڕێ بکۆڵێ چاڵێ بۆ مان
ئاڵە و شەوە بیبا چ دەکا با بیکا
مەیگێر شەوی خۆشە تێکە ئاڵێ بۆمان

زۆر کەس هەیە هەر دەوێژن و ناپێژن
ئەو ئێمە بە گێژ دەزانن و خۆیان گێژن
گۆیا ئەوی کووپە مەی دەکا دینی نیە
بۆ ئەو کەسی کوولەکەی دەکا چی ئێژن؟!

***

هێندێک بە خەیاڵ لە دین و ئایین ژیرن
لایەک بە گومان لە بێ گومانی گیرن
سەیری دەبێ تێ بگەن کە هیچ تێ نەگەیین
کەمتر لە سەری پیاز و پەلکی سیرن!

***

دەنگ بێژ و کچێک و گۆشەیەک پەیدا کەین
خۆشی سەر و دڵ لە ماچ و مەی داوا کەین
نە هومێدی بەزەی کەس و نە ترسی دوا ڕۆژ
با خاکێ بە با و ئاوێ بە ئاگر داکەین

***

خۆزگەم بە کەسێ نیشان و ناوێکی نەبوو
لە شوێن پڕ و پووچ خەیاڵی خاوێکی نەبوو
نەک وەک من و تۆ کوندە بەبوو ئاسایی
چاوی لە قەڵایەک بوو، کەلاوێکی نەبوو

گەنجت دەوێ ڕەنجی دەوێ واهات، وا چوو
کێ گوڵ دەچنێ دڕکی لە دەستی ڕاچوو
تا شانە نەبوو لەت لەت و جەرگی پارە
کەی دەستی بە کاکۆڵی جوانێک داچوو

***

دەروێشیەکەمان کیسەیەکی بێ بن بوو
مەیگێڕی جوان ڕێبەر و پیری من بوو
پێم وایە لە مەیخانە دەبێ وەی بینم
ئەو ژینی لە سووچی فێرگە دا لێم ون بوو

***

هۆزان و بلیمەتان و بیر ڕوون و پتەو
بۆ بوون و دەچن؟ کەس نە ئەمی زانی نە ئەو
تاریکە شەوێک گەڕان بەبێ ڕێ و ، گێژ بوون
ئەفسانەیەکیان ئەهۆنی چاویان چوە خەو

***

گەردوون کە گەڕا دژی نیازی من و تۆ
عاسمان بەمە چی، هەشت و حەوت بن یا نۆ؟
بمرم کە لەشم بەمن چی هەرچی دەیخوا
مێروولە لە گڵکۆ بێ، چ گورکی کەژ و کۆ

پرسی لە مراوی، ماسییەکی لابرژاو
کوا تازە بلێی بە جۆگە دا بێتەوە ئاو ؟
پێی گوت بەمە چی ؟ کە ئێمە مردین ، دنیا
دەریا بێ ، تراویلکە بێ ، یان هەور و ساو

***

وا مانگە وەسەر کەوت لە سووچی ئاسۆ
مەی تێکە بخۆینەوە شەوێکە و ئەمشۆ
دەس باوێ ملم ، مەترسە مانگ ئاوا بێ
زۆر دێتەوە سەر بدا لە گڵکۆی من و تۆ

***

ئەو خۆڵێ کە دێت چ زۆر چ تۆزکاڵێک بوو
کێل گەردەن و کوڵمە سوور و چاوکاڵێک بوو
شەرمێ بکە تۆزی دەتەکێنی بەرگت
ئەو تۆزە گڵی ڕوومەتی لێو ئاڵێک بوو

***

هەر پنجە گوڵێکی سوور لە گوڵزارێک بوو
ئەو سوورییە خوێنی دڵی دڵدارێک بوو
هەر پەڵکە وەنەوشەیەک لە هەردێ دەردێ
خاڵێکە لە سەر ڕوومەتی نازدارێ بوو

شەو فێنک و دەر سەوز و وەها مانگە شەوێ
با بخۆینەوە کوا هەلێکی دی هەڵدەکەوێ ؟
مانگ هەردێ ، بەهار دێتەوە ، تەنیا ئێمەین
دەمرین و دەبینە گیاو و گڵ لێر و لەوێ

***

تا هەل هەیە دڵخۆش بە، ژیان ڕادەبرێ
لەم خانوە ڕەشەی لەشە گیان دەر دەکرێ
ئەم کاسە سەرانەی کە دەبینی، سۆزی
ژێر قاچ و قولی کاسەکەران ڕادەخرێ

***

هەر شەو بوو لە مەیخانە دەهات ئاوازێ:
خۆشی لە کەسێک لە ئێمە مەی دەخوازێ
بۆ مات و کزی؟ گەلێکی وەک تۆ گەردوون
کردوونی بە تۆز و خۆڵی سەر ڕێبازێ

***

چاوجوان نە دەمی خەوە دە هەڵبێنە سەرێ
مەی تێکە لە کووپە چەند قومێکم بدەرێ
هاکا قوڕی خاکی من و تۆش هەڵشێلن
بکرێتەوە کووپە مەی لەکن گۆزەکەرێ

پرژاندی هەور لە دەشت و دەر بارانی
بێ مەی بی دەمێ تامی ژیان نازانی
وا ئێمە لە سەیری سەوزەزارین داخۆ
سەوزەی گڵی ئێمە کێ بکا سەیرانی ؟!

***

تای ماشەری ژین بەبێ وچان هەڵدەکرێ
زانا ئەوەیە: دڵخۆش دەژی بێ خەم بمرێ
مەیگێڕ خەمی چیتە بۆ سبەینەی قیامەت؟
بۆم تێکە هەتا دەرفەتە ؛ شەو ڕادەبرێ

***

لاوێچێ لە مەی سەد دل و سەد دین دێنێ
هەر تاقە قومێک مەملەکەتی چین دێنێ
چی خۆشە لە سەر زەوی وەکوو مەی نابێ
تاڵێکە هەزار گیانی شیرین دێنێ

***

دڵخۆشی دەدا مەی و دڵی خەم دەبڕێ
فرمێسکی ڕەزانە ، ئەشکی خەمبار دەسڕێ
زۆر سەیرە لە لام کەسێکی مەی دەفرۆشێ
چی چاتری پێ دەکڕێ؟ مەگەر مەی بکڕێ !

گیا شینی بەهاران هەڕەتی خونچە وەبێ
لات وایە بەهەشت ئەگەر هەبێ وەک ئەو بێ
مەیگێڕ وەرە تا بەهەشتی دنیا ماوە
هەشتێکی لە مشتە بێنە نەک نۆ بێ، نەبێ

***

زانا لە جیهان کەسێکە خەم دانەگرێ
دڵتەڕ بژی، وشکی لە دڵا ڕانەگرێ
تا سواڵەتی ژین بە بەردی مردن دەشکێ
دەستی لە ملی شووشەو و یار هەڵنەگرێ

***

چۆن تۆبە لە مەی دەکەی هەتا مەی مابێ ؟!
ئەو ڕۆژە مەخۆرەوە کە پەیدا نابێ
نەخوازە بەهار و چیمەن و دیمەنی گوڵ
تۆبەی چی؟ هەزار تۆبە لە تۆبەی وا بێ

***

بۆ ژانی دڵان هەر مەیە دەرمانی بێ
زانا ئەوەیە تامی لە مەی زانی بێ
ئەو کۆنە پەڕۆی لێوی لە مەی پێ دەسڕن
بەرماڵی هەزار سۆفی بە قوربانی بێ

کاتێ لە زەوی وەنەوشە سەر دەردێنێ
سروە دەمی خونچە ماچ بکا و ڕای ژێنێ
چەند خۆشە لە گەڵ خونچە دەمێ ڕای بوێری
تۆ تۆبەشکێن و ئەو دڵت نەشکێنێ

***

ئەو جوانە کە خۆم دەڵێم بە تەنیا جارێ
باوەش بە یەکا بکەین لە دەم ڕووبارێ
چیمەن گوڵ و سەوزەپۆش و ئێمەش سەرخۆش
پێم وابێ بەهەشت وایە ، بەڵام لێ بارێ

***

بۆم بان کەنە مەیگێڕێ کە : با مەی بێنێ
پیری چلەکێش بادەیە خۆی بنوێنێ
سەر خۆشێ بناڵێنێ لە نیوەی شەو دا
سەد نوێژی ڕیابازی مڕ و مۆچ دێنێ

***

شێخێ بە ژنی خراپی گوت: بێ شەرمی
بۆ هەرچی دەست بۆ بەرێ ساز و نەرمی
پێی گوت: بەڵێ من وەکوو دیارم هەر وام
تۆش داخۆ وەکوو نیشان دەدەی دڵگەرمی؟

گەردوون کە بە زانیاری بکردا کاری
چۆن وا پڕ دەبوو لە هیچ و پوچ و خواری
کەی ڕاستە هەژار و لێو بە بارن زانا
بێ مێشک و کەریش لە زێڕە ناڵ و باری!

***

گەردوون وەکوو دێو بەراوەژوون ئاکاری
هاواڵی نەزانانە ، دژی زانیاری
مەیگێڕ وەرە هۆشم بەرە بەڵکوو جارێک
لێی تێکچێ بە لای ئێمە بچەرخێ باری

***

هۆشم کە دەبێ خەفەت دڵم دەردێنێ
سەرخۆش کە دەبم : هۆش لە سەرم نامێنێ
کاتێکە نە زۆر مەست و نە زۆر وشیارم
گیانم بە فیدای ئەو دەمە دنیا دێنێ

***

چاو جوانە بەیانە و کەڵەشێر دەخوێنێ
بانگێکی لە مەیگێڕ بکە با مەی بێنێ
داخۆ شنەبای بەیان، خوناوکەی باران
کەی بێنێ لە سەر گۆڕەکەمان بڕژێنێ

ئەو کۆشکی ملەی دەکرد دەگەڵ عاسمانێ
شاهانی دەکەوتەوە لە دەرک و بانێ
دیتم پەپوسێمانەیە لێی دەخوێنێ:
کوا بگرە ووو بەردەت؟ ، بەزم و ڕەزمت کوانێ؟

***

خەم بۆچی لە سەر بوون و نەبوون دادەگری؟
دوا ڕۆژ چیە کەی دێ؟ چتە وا بۆی دەگری؟
مەی فڕکە! مەترسێ بە قەرز ، نازانی
نێوانی هەناسەیەک دەژی یان دەمری؟

***

بێ خەم بە ، ژیان هەڵێکە هاکا مردی
تاوێری مەرگ گلا و لە بنیا وردی
نازانی لە کوێوە ناردراوی ؛ سا بە خودا
ناشزانی مەرگ ، کە مردی بۆ کوێی بردی

***

ناچاری ئەشێ باری مەرگ هەڵبگری
ناشێ هەموو دەم لە ترسی مردن بمری
خوێن و ڕەگ و پێستێک و دوو سێ ئێسقانێک
وە بزانە نەبوون ، بۆچی یە خەم دادەگری ؟

وە بزانە جیهان بە ئارەزووی تۆ دەگەڕێ
ئەم چەرخ و خولەی هەمووی بە فووی تۆ دەگەڕێ
وەبزانە کە سەد ساڵێ ژیاوی ، پاشان چی؟
مەرگێکە لە سەر ڕێگە لە دووی تۆ دەگەڕێ

***

دنیا وەکوو خۆیەتی و مرۆ نامێنێ
تۆ تۆزی ئەویش هەر وەکوو سۆزی و دوێنێ
ئێمەش کە نەهاتبووین وەکوو خۆی وابوو
لێشی دەردەچین کەمایەسی ناهێنێ

***

ژیانت چیە ؟ تا چووک و شلی ، شاگردی
وەستای کە گەیشتی ، پاشی: پیری ، مردی
پوختایی وتار لە من ببیسی باشە
تۆزێکی لە خۆڵ بەرز ببووی ، با بردی

***

زانیوتە لە حەوت و چوارەوە هاتی کە بووی
گێژیت و لە بیری چوار و حەوتا ون بووی
ئاسوودە بژی هەزار کەڕەت پێتی بڵێم
نایەیتەوە گەر مردی ، ئیتر چووی هەر چووی

مەی تێکە وەخۆ دەرفەتە ؛ هاکا مردی
لەم ژێر گڵە بێ هەواڵ و بێ هاودەردی
وا پێتی دەڵێم شتێک لە لای کەس مەیڵێ
نابێتەوە گوڵ پەلکە گوڵێ بابردی

***

گەردوون وەکوو منداڵە لەبەر بێکاری
خستینیە دەرێ وەک مت و موور بۆ یاری
تاوێکی لە بەر دەستی ئەوا دێین و دەچین
دەخرێینەوە سندووقی نەمان یەکجاری

***

ڕابوێرە ، دڵت خۆش کە چما خەم لە بەری
دەرفەت لە دەست ئەگەر نەدەی بەختەوەری
یەک جارە کە درۆایەوە هەڵ نادەیەوە
هۆشی بدەرێ ! مرۆی ، نە سەوزە و کەوەری

***

ئەم خەڵکە، لە کارگای خودا دێتە دەرێ
هەر کاری ئەویشە سیس دەبێ و هەڵدەوەرێ
ئەی خوایە! ئەگەر باش بوو لە پای چی نەت هێشت؟
گەر پووچ و چرووکە ، کێیە کردوویە بەرێ ؟

سەرخۆش دڵی نایە پیاڵەیەک بشکێنێ
هەر تۆزێ لەبار و ڕێک و پێک بنوێنێ
خوا ئەو هەموو لاشە ناسک و لاوچاکە
بۆچ ڕێکی دەخا و لە داخی کێی دەڕزێنێ ؟!

***

پرسیم و نواڕیم و گەڕام لێر و لەوێ
هیچ بەڵگە نەبوو تەمی گومانم بڕەوێ
ناژین بە خەیاڵی ئەو بەهارەی نایە
تا ماوە ژیان.. بادە لە دەستمان نەکەوێ

***

گەردوون بە دزی دوێنێ لە لام درکاندی
هەرچی بەسەرت دێ لە دەس ئێمەت زانی
لەم چەرخ و خولەم دا دەسەڵاتم بوایە
خۆم ئێستە ڕەها دەکرد لە سەرگەردانی

***

مەیگێڕ مەیە بەر باری خەمان ، مەی با بێ
چا نابێ جیهان بە ئێمە ، با دڵ چابێ
چت دێتە بەرێ لە ڕێی ژیان گوێی مەدەرێ
هەرگیز وەکوو ئاواتی دڵی کەس نابێ

چووکێک لە کەلاوەیەک لە بەر لابایێ
دەیکوڵی بە دندووکی ، سەری پاشایێ
پێم وابوو دەڵێ : بمگرە گەر دەتوانی
بەو کەللهیە سوێند دەخۆم لە دەستت نایێ

***

دیم گۆزەکەرێک قوڕی دەشێلا دوێنێ
دەنگێکم دەبیست ، باوکە کوڕی دەدوێنێ :
ڕۆڵەم بەزەییت بە بابی خۆت دانایە ؟
مەمشێلە بە قەو بە هێمنی پێم لێ نێ !

***

مەیگێڕ وەرە مەی بێنە زەبوونی بۆچی؟
با پێ بکەنین داخ لە دەروونی بۆچی ؟
کێ پرسی بە تۆ کرد لە نەبوون و بوونا ؟
بێهوودە کزی بوون و نەبوونی، بۆچی ؟

***

هەرکەس کە دەسی بە تیکە نانێ بڕەسێ
لاکۆخی هەبێ ، شەوانە تێی دا وەحەسێ
چەند خۆشە ژیانی وا چ ئازادە بە دڵ
بۆ خۆی بێ ، نە ئاغا بێ ، نە بەردەستی کەسێ

ڕۆژی و تەمەنت پتر بکەی ، ناتوانی
بۆ زۆر و کەمیش پەرۆش و سەگەردانی
زۆر دەستەوەسانیت و بزۆزیشی بە دەم
ئاواتی دڵت لە مێو بکەی نازانی

***

نەیخۆی و نەپۆشی ، ئەدی بۆ چیت کۆشی ؟
سەرقاڵی ! شەو و ڕۆژ دەکڕی و دەفرۆشی
لێو تەڕکە بە مەی ، لێوی کچۆڵێک بمژە
ژێر گڵ هەر دەبی ، پەرۆشی یان دڵخۆشی

***

بڕوات کە بە دنیایە لە تەکمابە دەمێ
بڕوانە لە گۆڕسان و ڕامێنە کەمێ
مێروولە کە کێشەوەی دەکەن لێر و لەوێ
هەر یەک لە دەمی دایە گڵی خونچە دەمێ

***

دەستم کە بڕۆیبایە خودا ئاسایی
گەردوونی ترم دەخستە ڕوو سانایی
بەدبەختی بەشی نەزان و نامەردان با
دڵخۆشیم دەدا بەرامبەری زانایی

مەیگێڕ وەرە! گا زەوی لە پشتە ، بەمە چی ؟
بادەم بدەیە جند و فریشتە بەمە چی ؟
مەیخانەیەکم نیشان دە ، ئەوسا دنیا :
مزگەوتە هەمووی ، دێر و کەنشتە، بەمە چی ؟

***

یان دەچمە بەهەشت هۆری لە دەورەم کۆ بێ
یان ئاگرە جێگەم بە چزە و بۆسۆ بێ
جوانێک و مەی و نەی و بەهارێک بۆ من
چیم ناگەرەکە ، قەرزی بەهەشت بۆ تۆ بێ

***

دلبەر کە بمان داتێ مەیێک و ماچێ
بەرماڵ و ڕدێن بە توونی ئاگر داچێ
دڵتەڕ لە جەهەندەمابێ ، سا دەرکی بەهەشت
گیراوە بە قوڕ تازە کەسی تێ ناچێ

***

ئۆخەی کە نەما باوی خەیاڵی خاوی
مەیگێڕی دەبینمەوە بە بادەی ئاڵی
گێرەی ڕەمەزان بەربوو ، ئەوا جێژن هات
دەم بێنی لە دەم گا و کەران ڕاماڵی

مەیگێڕ لەمە بڕوانە بە سیلەی چاوێ
ڕابردوو ، نەهاتوو ، لە سەرت دەرباوێ
تاکەی خەمی زوو کۆچ دەکەم و دێر هاتم ؟
مەی تێکە وەخۆین درەنگ و زووی پێ ناوێ

***

مەیخۆرەوەکان دە وەرن و ساز دەین کۆڕێ
مەیگێڕ وەرە با دەفری شەڕاب هەڵچۆڕێ
دەیزانی خودا ڕۆژی بەرێ ، مەیخۆرین
تێکی مەدە ، زانستی خودا ناگۆڕێ

***

مەی خۆرەوە نی و لە ئێمە هاتوویە گەمەی
خۆشت بە دزی هەزار دزی و حیزی دەکەی ؟
فیزمان بە سەرا لێ مەدە مەستی ناکەی
هەر کارێ دەکەی هەزار کەرەت خۆزگە بە مەی

***

جوانی بە پەلە و بەبێ نەوەستان ڕۆیی
ڕۆژگاری ژیان وەک شەوی مەستان ڕۆیی
ئەم ژینە کە هەر دەمێکی دنیای دێنا
داخم کە بەبێهوودە لە دەستمان ڕۆیی

زستانی ژیانە وا قەلی مەرگە قڕی
پیری مڵەیەک بوو ڕەگی لاویمی بڕی
باڵداری جوانیم لە لکی ئاواتم
هاوارە لەمن چ زوو بە زوو نیشت و فڕی

***

ڕابرد تەمەنم هەموو بە نافەرمانی
نەینووکی دڵم لە چەوتی ژەنگی هانی
هێشتا بە هومێدی بەزەییم چون هەرگیز
پێم وا نەبوو دوانی ، هەر بە تاکم زانی

***

فەرمووتە عەزابم هەیە ترسو لێ بێ
لەم گفتە دەبێ ئەوی بترسێ کێ بێ ؟
تۆ ڕەحمەتی، لە کوێ بی ، عەزاب بێکارە
ئەو جێیە کە بێ تۆیە دەبێ لە کوێ بێ ؟

***

چاوم کە بە گریانەوە بوو ، یار تاوێ
دەیڕوانی لە ئەشکی من بە گۆشەی چاوێ
بەم چاکەیە لە نیازی گەیشتم کە دەڵێ :
تۆ چاکە بکە و بیبە دە ئاوی هاوێ

بوولێڵە کە هات ، مەپرسە کەنگێی ساڵە
مەی فڕکە لە خورێنی بە تاس ، بە پیاڵە
شێخ وازی لە هەنگوێن و گەزۆیە و من مەی
مەی تاڵە دەبێ هەق بێ ، دەڵێن : هەق تاڵە

***

شێخ ویستی لە دەردی یار و مەی چا بمەوە
بۆ ژینی لە پاش مەرگ ئەشی پا بمەوە
نازانێ کە بۆچ هۆگری یار و بادەم ؟
پێم خۆشە لە حەشریش دەگەڵی ڕابمەوە

***

گۆیا لە بەهەشت مشە و فشەی خۆراکە
هوری و کوڕ و هەنگوین و شەڕابی پاکە
بۆم تێکە بەیادی کۆنە قەرزان مەیگێڕ
ئەم دەنگی دەهۆڵە تا لە دوور بێ خۆشە

***

لێم بۆتە مەتەڵ : بەهەشتە، جێگەی حوورە
هەنگوێن و کەرە و شیر و مەی و کافوورە
با ئێمە بە مەی لێرە بەهەشتێ ساز دەین
تا پیاوی هەژار دەگاتە بەغدا ، دوورە

شووشەی مەیەکەت بۆچی ڕژاندم خوایە ؟
وەک شووشە، نەشە و دڵت شکاندم خوایە ؟
مەیخۆرە منم کەچی یەکی تر دەگرێ !
بمبوورە لە پەردە دا گەیاندم خوایە

***

دنیایە لە( کەو) دە ، بێ گوناهێکی نیە
کەس بێ هەڵە نەژیاوە لە سەر ئەم زەوییە
من کردە خراپ و تۆش خراپەم توش کەی
جیاوازی لە نێوان من و تۆ ، خوایە چی یە ؟
لە کەو دە = لە بێژنگ دە

***

بەخشین ، لە گوناە و هەڵە چاو پۆشینە
تۆ چۆن هەڕەشەت بە ئاگری پڕ تینە
بم بەخشی بە نوێژانەوە کەسمان لە کەسە
بە گوناهەوە بم بەخشە دەڵێم بەخشینە

***

مەیخۆر کە نەبن کاول دەبن مەیخانە
خوێنی دە هەزار تۆبە لە گەردنمانە
بەخشین چ دەکا ئەگەر گوناهبار نەبێ ؟
لە گوناهەوە بەخشین و بەزەی خوا جوانە

هەر ڕێیە بڕیم گشتی هەڵە و لاڕێیە
وا دێمە پەنات باری گوناهم پێیە
بم بەیتە بەهەشت ئەگەر بە نوێژ و ڕۆژوو
سەودایە ، ئیتر بەخشەکەت لە کوێیە ؟

***

کێ ڕۆژی بەرێ قوڕی منی شێلاوە ؟
کوڵکە و مەرەزم بە کام تەشی ڕێسراوە ؟
کارم کە یەکی نەگرت و لێم ئاڵۆزا
سووچم چییە؟ لای خۆتەوە هەڵپێچراوە

***

ئەی تەکیەنشین شێخی بە سۆرە و تۆرە
پێت وا نەبێ هەر مەستی یە ، کارم زۆرە
من خوێنی ترێ دەمژم و تۆ خوێنی هەژار
جوابم دەرەوە کێیە پتر خوێن خۆرە ؟!

***

دەروێش وەرە ئەم حاو و حوەت بێ خێرە
دەم بەستەی و تەزاوی وەکوو گاگێرە
خوا چاوی لە دەستت نییە ڕۆژووی بدەیەی
ژیانێکی کە پێی داوی بە مەی بسپێرە

دنیا بە دەسی دەستە کەر و گایێکە
هەر جاشەکەرە: وەزیر و پاشاییێکە
دیندار بە کەسێ دەڵێن نەزان و گێژە
هەرکەس کە دەڵێن کافرە زانایێکە

***

خوێنتاڵی مەلا ! بە ڕیش و پەشم و جبەوە
ئەمڕۆشت لە دەست دەچێ بە بیری سبەوە
زۆر وشکی دەبی بە دەستەچیلەی ئاگر
فەرموو وەرە مەیخانە دەمێ تەڕ ببەوە

***

وا چاخی گوڵە و دار و دەوەن گوڵ پۆشە
دەروێش وەرە بەر! وەرگرە مەی بینۆشە
بڕوانە لە گوڵ بە ئەقڵی تۆ پێ دەکەنێ
بۆ بیری جەهەندەم ، دڵ و ڕووت ناخۆشە

***

هەر کەس کە تەواوە ناتەواوی ماڵە
کێ خێوی کوڵاو و کاڵە بۆ خۆی کاڵە
خوێنتاڵە هەتا مەلان لە ناو شیرنایی
کێ ڕووگەش و خوێن شیرنە ژینی تاڵە

خوێنتاڵت دەوێ؟ ئێسکی گرانت گەرەکە ؟
بۆ تەکیە بچۆ کە دەرد و ژانت گەرەکە
مەیخانەیە جێی لێو بەبزە و ڕووخۆشان
مەیگێڕێ ببینە گەر ژیانت گەرەکە

***

خاییام کە سەرت گەرمە بە مەی دڵخۆش بە
دەس لەملی کچۆڵەیەک دەکەی دڵخۆش بە
دوا ڕۆژی هەموو شتێک نەبوونە و چوونە
وای دابنێ هەر نەبووی ، کە هەی دڵخۆش بە

***

گایێکە لە عاسمان و ناوی کۆیە
گایێکە دەڵێن هەڵگەر هەرد و بۆیە
سەیری کەرەگەل بکەی لە ناو ئەم جووتە
گەر ژیر و بەبیری سەیری خۆش بۆ تۆیە

***

ڕۆیین و زەمان پەشێو و ئاڵۆزاوە
سەد گەوهەر و دوڕ یەکێکی لێ نەسماوە
داخی بە دڵم هەزار وشە و بیری چاک
کەر بوونەتە لەمپەر و نەبێژراو ماوە

ئەی خوایە لە کارت سەری زانا گێژە
شیرنایی دەنێ یە دەم ؛ دەڵێی مەی چێژە
خۆت جوانی دروست دەکەی ، دەڵێی مەی بینە
پیاڵێکی پڕاوە، لاری کە و مەیڕێژە

***

دیم پیرێ لە مەیخانە سەری دەخولاوە
ناترسی ؟ وتم ، کە بمری ؟ چت بۆم ماوە؟!
فەرمووی وەرە پێداکە، گەلێ وەک من و تۆ
ڕۆیشتن و کەس نەهاتەوە لەو لاوە

***

لەم ڕێگە درێژە کە مەرگی ناوە
کێ هاتەوە باس و خەبەری هێناوە ؟
وەستان لە دوو ڕێیانی نیازی پڕ و پووچ
بێهوودەیە ، هەرچی چوو نەهاتە دواوە

***

خشت پێژی هەتا کەنگێ بە سەر دەریاوە
ئاخ چەندە ڕقم لە بت پەرس هەڵساوە!
کابرای کە دەڵێ دەچتە جەهەندەم خەییام
چۆن زانی؟ چ دێوێک خەبەری پێ داوە !؟

دوو ڕوویی بەسە ، ڕوو دەکەمە مەیخانە
ئەم ڕیشی سپی بە مەی بڕەنگێ جوانە
پێوانی تەمەن گەیشتە حەفتا تا کەی
خۆم هەر وەکوو هەم نیشان نەدەم ، شێتانە ؟

***

مەی تێکە ! هەرایە ! پێم دەڵێن بێ دینە
چۆن ڕەنگی بەرم ؟ پەڕۆم لە هەش دا شینە
بەرماڵە گوناهبارەکەشم وا شڕ بوو
هەڵناگرێ تەقەڵ بە بارێ بیکەین پینە

***

مەیگێڕ وەرە بۆم تێکە دڵم زۆر تەنگە
کێ باشە ؟ هەموو کەس دە ڕوو و سەد ڕەنگە !
با مەی بپەرستین و ئیتر واز بێنین
تا وابێ موسڵمانەتی شەرم و نەنگە

***

مەیگێڕ بە سەرت پردی سیڕاتیش کەڵەکە
سەیرانی بەهەشت سەیری دوو چاوی بەڵەکە
زۆرم لە خودا ویست و کەمیشی نەگەیی
هەر تۆبەیە دەمداتێ ئەویش نەم گەرەکە

خۆ دوورە کتێب بگرە ، گەمەیٚ منداڵە
ژێر بیری لە سەر شەڕاب و لێوی ئاڵە
هوشت بێ هەتا خوێنی نەڕژتووی گەردوون
تۆ خوێنی کچی ڕەزان بڕێژە پیاڵە

***

تازەم کە بە کەونە مەی ، جیهانیش کەونە
زۆر لاش و سەری تێوە درا ئەم تەونە
چۆن هاتی؟ چلۆن دەچی ؟ چلۆن بووی و دەبی ؟
خەو دات نەگریٚ وەکوو خەیاڵ و خەونە

***

لەم بیرە کە چین نهێنی پشتی پەردە
هەر بیرەوەریٚ کاس و بەداخ و دەردە
ئەفسانەیەکی دوور و درێژ و بێ بن
دەستێ بەرە بۆ پیاڵە ، دەست لەو بەردە

***

چم بیستووە لەم جیهانە یان چم دیوە
زانیومە چییە ، هیچ نەبێ نیوە و نیوە
مردن چیە؟ هەرچی دەکەم و دەکرێنم
شێواوم و سەر نابەمە دەر لەو شیوە

لەم هاتنە بێهوودەیە بیرم شاشە
سەرباری خەمان بیر و خەمی ئەولاشە
مەیگێڕ وەرە قۆڵ هەڵکە گڵێنەت بێنە
خەم چڵکی دڵە ، بە مەی بشۆرین باشە

***

بێ دلبەر و مەی تەمەن بەسەر چوون هیچە
بێ ڕەنگی مەی و دەنگی بلور ، بوون هیچە
ئازا و بە دڵخۆشی بژی چەند ڕۆژێک
ڕابوێرە ، لە هیچ بیر مەکەوە ، گەردوون هیچە

***

مەیگێڕ وەرە بۆم تێکە ئەوا نیوە شەوە
بەس بیری لە مزگەوت و کەنشتان بکەوە
دڵتەنگی جەهەندەمی و بە ئاواتی بەهەشت؟
دایناوە خودا کوێندەری. بەس لێکی دەوە

***

دڵتەنگی مەرگ نابێ ئەوەی لێزانە
ئەم مانەوەمان وچانی ڕاگوێزانە
تێر سەیری گوڵت نەکردووە بوویتەوە گڵ
لە شوێن گوڵە نەورۆزە گەلاڕێزانە

زستانه هەتا ڕوو دەکەمە مەیخانە
هەر لاسکی گوڵە و لە دەوری ئاگردانە
وەدیارە نەیاری جوان و ڕووخۆشە جیهان
تۆڵەی دەمی پێکەنینە ئەم سووتانە !!

***

ئەم هاتن و چوونی ئێمە چی لەدوایە؟
کێی وا هەیە لەم گلۆڵە هەڵکا تایە؟
ئەو لاشە هەموو دەکەونە ئاورگی نەمان
سووتمانی وەهام نەدیوە ، دووکەڵ نایە !

***

هەرچێکی هەڵێ ، بەشی لە ئاوا بوونە
سەرکەوتنی هەوراز و بەرەوژێر چوونە
شین بووی لە زەوی ، پێ دەگەی و دەت هێڕێ
ئاشێڕە خودا و ئاشەکەشی گەردوونە

***

ئەم کۆنە سەراوپەردە کە دنیای ناوە
شایی لە بەرێک ، شینە لە پێنسەد لاوە
ئەم خوانچەیە بەرماوی هەزار جەمشیدە
گۆڕە و گەلێ بارامی تیا نێژراوە

